# ڕێنوس

## چۆنیه‌تی نووسینی کوردی

١٣٨٩ - ٢٥٨١

١٩٦٩

طاهر صادق

له چاپه مه نیه كانى

كتيب فروشى سيديان

له مه ها باد

# رینوس

## چۆنیەتی نوسینی کوردی

دانەر

طاهر صادق

١٣٨٩ سالی ١٩٦٩

٢٥٨١

چاپخانەی شیمال ـ کەرکوك

طبع بموافقة وزارة الثقافة والاعلام في ٢٠/١٠/١٩٦٩

# پێشکەشی

پێشـــکەش بێ

- بەو گیان پاکانەی کە زمانەکەی خۆیان خۆش ئەوێت ٠
- بەو تێکۆشەرە دڵسۆزانەی هەمیشە ماندون بۆ بەرز کردنەوەی زمانەکەیان ٠
- بەو بە ڕیزانەی هەســـت ئەکەن و ئەزانن کــە نرخی نەتەوە بە نرخی زمــانەوەیە ٠
- بەو ئەو جەوانانەی کـــە هۆدار و تاوانبــار نین لـــە فێر نەبونی زمـانی دایك و باوکیان ٠

کەرکوك ٢٥/١٢/١٩٦٩ ـ طاهر صـادق

---

# تکا

بۆ دانانی ئەم چەند لاپەرەیە هەمو هێز و توانایی خۆمان تیا بە کار هێناوە لەگەڵ ئەوەش گومانی تێدا نیـە کە هەڵە و کەم و کورتیشی زۆرە بەڵام هەر چۆنێك بێت داوای بورین ئەکەین لە خوشك و برا بە ڕیزەکانی خوێندەوار وتێگەیشتو لەو بابەتەوە . وەئاگادارمان بفەرمون لەو شـــوێنانەی کە تیدا بە هەڵە چوین بۆ ڕاست کردنەوەی گەر جاری دووەم لە چاپمان داوە ٠

---

تـبی :ـ پیتەکانی نیشانەداریان زور کەمە لە بەر ئەوە داوای بورین ئەکەین .

# پیشەکی

بێ گومان زمانی کوردی لەو زمانانەیە کە زۆر دوا (١) کەوتووە لەگەڵ ئەوەش جێی سەیر و سەر سورمانە کە بەم جۆرە ماوەتەوە چونکە بۆ خۆش کردن و رێك ستن و پێشکەوتنی هیچ جۆرە دەسکاریەك و خزمەتێك نە کراوە . تەنیا پاش ساڵی ١٩٢٠ بەرە بەرە دەست کرا بە کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی لە کوردستانی عیراقدا هەر لە لیوای هەولێر و سولەیمانی بە کوردی خوێندن بۆ ئەو ئامانجەش چەند پەراوێك وەرگێر درا بۆ کوردی بە داخەوە ئەو جولانەوەش هەتا سەر نە بو وردە وردە روی کردە کزی و چك بون .

لە ماوەی پەنجا ساڵەوە تا ئیمڕۆ بە هەموی چەند سەد پەراوەکی کوردی بلاو و لە چاپ دراوە کە بە ساڵێك دە چاپ کراو کەمێك کەمتر یان پتر ئەکات ، ئایا بەوە چی ئەگوترێت ؟

کە ئیمە لە رۆژگاری پشکنینی ئەستێرەکان و چونە ناو مانگە ئەژین .

هەر لەو ماوە دور و درێژەوە تاکو ئیستا دە پازدە گۆڤار و رۆژنامەی کوردی بلاو بوێتەوە بە هەر چوار ساڵ گۆڤارێك یان رۆژنامەیەك دەرچووە تەمەنی هەر یەك لە وانەش وەك کزی میوە کورت و زو بە سەر چووە و داخراوە ئەنجا بە هەر چی هۆیەك بێت .

لەگەڵ ئەوانەی کە باسیشمان کرد هونەر مەندەکانی هەڵبەستەی کوردی مەردانە هۆنراوەیان بە کوردی داناوە لە کۆنەوە تا ئەم کاتە کە ئەوەش جێی لاف و شایانی شانازیە هەتایی .

---

(١) دوا کەوتوین بە گوێرەی زمانەکانی زندو نەك زمانی فارس و تورکی .

له بابەت سەرچاوە و فەرهەنگ (۱) و ریزمـان (۲) و پەراوی زۆر بێ مایە و هەژارین .
خۆ کۆزمان تا ئەم کانە هەست و جولەی نیە ، چاوە نواری لێرە و پاش ئەکەین .
پاش ئەو هەمو کەم و کورتیە بۆ نوسینی کوردی رێنوسێکی دامەزراوو چەسپاوی

(۱) زمانە زیندووەکان ژمارەی فەرهەنگەکانیان گەیشتوتە (۱۵۰۰) فەرهەنگ بەلام بە ناوی فەرهەنگی کوردی تا ئیمرۆ دوازدە فەرهەنگ هەیە .
- فەرهەنگی نەوبەهار دانەری أحمدی خانی بریتیە لە چەند لا پەرەیەك .
- أحمدی دانەری شیخ معروفی نۆدێ ، ئەوەش چەند لا پەرەیەکە .
- فەرهەنگی جنرال دانەری ئۆغۆستۆبابا کە بریتیە لە ۸٤۲۸ وشە ..
- الهدیه الحمیدیه دانەری یوسف ضیاء پاشایە ، کەم و کورتی زۆرە وە کەمیشە .
- فەرهەنگی کوردی ـ ئینگلیزی دانەری میجەر سۆنە ئەوەش زۆر نیە .
- رابەر دانەری گیو موکریانی کە بریتیە لە ٤۰۰ لا پەرەی ناوەندی .
- مەردۆخی دانەری ( آیة الله ) کوردستانی ، کە شکۆلی نوسراوە .
- فەرهەنگی مەهاباد دانەری گیو موکریانی لە کوردی بۆ عەرەبی ، ۸۰۰ لا پەرەیە .
- فەرهەنگی خاڵ دانەری شیخ محمدی خاڵ جزوی یەکەم تا پیتی (ج) نوسراوە .
- فەرهەنگا کوردی دانەری جگەرخوین زۆری ناوی گوند و شار و جیکایانە .
- فەرهەنگی کوردی ـ ئینگلیزی دانەری توفیق وهبی و ئەدمۆندس .
- فەرهەنگی کوردی دانەری مراد ئاو رەنگ لە کوردی بو فارسی هەر پیتی ئەلف و بێ ۳۵۰ لا پەرەیە .

(۲)
- صرف و نحوی کوردی دانەری مەلا سعید افندی .
- قواعد اللغه الکوردیه دانەری توفیق وهبی بەگ .
- قواعدی زمانی کوردی دانەری نوری علی امین .
- ریزمان دانەری نوری علی امین .
- دەستورا زمانا کوردی دانەری جگەرخوین .
- ریزمان دانەری شیخ محمدی خاڵ و نوری علی أمین .

بۆ دا نە نراوە ، هەر کەس لە سەر بیر و باوەری خۆی ئەروات ئەگەر راست بیت یان فری بە سەر راستیەوە نە بیت .

زۆر وا ئەنوسن آو ، آزا ، آسمان ، لە باتی ئاو ئازا ، ئاسمان . یا ئەنوسن مراویی کوردیی ، گەردیی بە دو [ی] لە باتی بنوسریت مراوی ، کوردی گەردی .

یا ئە نوسن [گوناە] «٣» کە ئەم نوسینە نەك لە کوردی لە عەرەبیش هەر هەڵەیە چونکە ئەم جۆرە [ە] یە نا کەویتە دوایی وشەوە . یا زور وشە بە دو [و] ئەنوسن بە بێ پیویست .

لیرەدا منیش بە پیویســـتم زانی کە ئەم چەند تیبینیانەی خۆم چاپ و بلاو بکەمەوە بە ئومیدی سود و کەلك وەرگرتن .

---

«٣» گوناە ـ گوناح بە کوردی تاوانباری . وشـــەی گوناە ـ گوناح لە «جناح» وەرگیراوە .

لە فارسی ئەبیت گوناە . پەناە ـ شاە ـ سیاە بەلام لە کوردیا نە وا هەڵ نەکەوی وە نە ئەم چەشنە (ە) بە نەکەویتە دوایی وشەوە

# میژوی پیتەکانی عەرەبی

لە بەر لەوەی کە ئیمە بە پیتەکانی عەرەبی ئەنوسین پیویستە کەمیك لە بنج و بناوانی ئەم پیتانە بزانین . بێ گومان میژوی نوسینی عەرەبی و پیتەکانی گەلێ ئالۆز و باش رون نە بویتەوە ، هەندێ لە پسپۆرەکانی زمان زان ئەڵێن سەر چاوەی نوسینی عەرەبی یەك لە مانەیە سریانی ، فەنیقی [ نوسینی ئارامیەکان ] ، عیبری ، مسماری [ نوسینی بابلیەکان ] هیرۆغلیفی [ نوسینی فرعەونەکانی مصرە ] .

عەرەبی یەمەن لە کۆنەوە بە نوسینی [ مەسنەد ] وە عەرەبی شام بە نوسینی فەنیقی وە عەرەبی حجاز بە نوسینی سریانیان نوسیوە کە تاینی ئیسلام پەیدا بو قورئانی پیرۆز بە نوسینی کوفی نوسراوە ، ئەو نوسینەش زۆر دەسکاری تیدا کراوە بۆ ریك و جوانی تاکو گەیشتوتە پلەی ئیمرۆ هەر وەهاش سەر و بۆر و ژیر و شەددە و هەمزە و خاڵەکان بۆ پیتەکان دانرا لەلایەن مامۆستای یەکەم [ أبو اسود الدؤلی ] و [ نصیر بن عاصم ] و [ یحی بن یعمر ] و [ خلیل بن احمد ] .

باش ماوەیەك نوسینی [ نسخ ] و [ ثلث ] و [ رقعە ] و [ دیوان ] و [ عربی ] و فارسی پەیدا بو کە ئەو نوسینانە لەو پەری جوانیەوەیە .

# پیتەکانی عەرەبی

پیتەکانی عەرەبی ژمارەیان ٢٨ پیتە :ـ ا . ب . ت . ث . ج . ح . خ . د
ذ . ر . ز . س . ش . ص . ض . ط . ظ . ع . غ . ف . ق . ك . ل
م . ن . و . ه . ی .

❁ لەم ٢٨ پیتە تەنیا ٢١ پیت بۆ زمانی کوردی گونجا و دەسق داوە وەك ا . ب
ت . ج . ح . خ . د . ر . ز . س . ش . غ . ف . ق . ك . ل . م
ن . و . ه . ی

بەلام بە هیچ جۆرەك ئەم حەوت پیتەی خوارەوە بۆ نوسینی کوردی و لەگەل
زمانی کوردی نا گونجێ وەك ث . ذ . ص . ض . ط . ظ . ع .

❁ پاش ئەوەی کە ٢١ پیتی باس کراو وەرگیرا دیترا زۆر کەم و کورتی هەیە لە نوسینی
کوردی بۆ رزگار بون لەو تەگەرەیە پێنج پیتی تریان پێك هێنا بە لاسایی پێنج پیتی
عەرەبیەوە وەك .

پیتی [پ] بە لاسایی پیتی [ب] .
پیتی [چ] بە لاسایی پیتی [ج] .
پیتی [ژ] بە لاسایی پیتی [ز] .
پیی [ڤ] بە لاسایی پیتی [ف]
پیتی [گ] بە لاسایی پیتی [ك] .

❁ لێرەدا هەر چەند کە ژمارەی پیتەکانی کوردی گەیشتە ٢٦ پیت بەلام تەگەرەی نوسین
هێشتا هەر ما چونکە نوسینی کوردی چون لە زار دەر ئەچێت وا ئەنوسرێ بە ئاسانی
و بێ ماندو بونی مێشك لە بەر ئەوە بە پێویست زانرا کە پێنج پیتی تر بە نیشانە
جێ بە جێ بکرێت وەك .

پیتی رێی گران [ ڕ ] .

پیتی لامی قەڵەو [ ڵ ] .
پیتی واوی کراوە [ ۆ ] .
پیتی هێی کز [ ە ] کە بەرامبەری سەرە لە عەرەبی .
پیتی ( ێ )ی خاو ( ی ) .

❃ زۆر نییە پیر لە [ئا] کراوەتەوە کە [ئا] نرخی دو پیتە ئەلفی کورت ( ئـ ) وە ئەلفی درێژ [ ا ] بۆ کوردی واتەگونجی کە بنوسرێت ئاسن نەك آسن . ئاسمان نەك آسمان ئازا نەك آزا .

❃ لێرەدا شیوەی کافی شیواو هەیە وەك کیو . کیرد . گێژ هەر چەند وینەیەکی تایبەتی بۆ نە کیشراوە .
وە هەر وەهاش شیوەی گافی شیواو وەك گیا . گیژ . هەنگوین . پیویستە هەر دو دەنگە بە پیت دابنرێت .

# ژمارەی پیتەکانی کوردی

- ژمارەی پیتەکانی کوردی ٣٤ پیتە وەك ئـ . ا . ب . ت . پ . ج . ح . خ چ . د . ر . ڕ . ز . ژ . س . ش . غ . ف . ڤ . ق . ك . کاف شیواو گ . گاف شیواو . ل . ڵ . م . ن . و . ۆ . ه . ە . ی . ێ .
- پیتەکانی خاڵدار ژمارەیان ١٦ پیتە بە هەموی ٣٠ خاڵیان هەیە .

پیتی ب . ج . خ ز . غ . ف . ن هەر یەکە خاڵەکیان هەیە .

پیتی ت . ق یـ . ێـ هەر یەکە دو خاڵیان هەیە .

پیتی پ . چ . ژ . ش . ڤ . هەر یەکە سێ خاڵیان هەیە ،

- پیتەکانی نیشانەدار ژمارەیان شەش پیتە هەمویان نیشانەکانیان ئەکەوتە سەرەوە تەنیا پیتی ڕێی گران نیشانەکەی لە ژێرەوە بێ باشترە تاکو لەگەڵ پیتی [ز] یا پیتی [ژ] بە هەڵە نەچین . پیتەکان ئەمانەن :ـ

پیتی کاف شیواو ـــ ئەبێ نیشانەیەك لە سەر پیتی کاف سادە دا بنرێ .

پیتی گاف شیواو ـــ ئەبێ نیشانەیەك لە سەر پیتی گاف سادە دا بنرێ .

پیتی لامی قەڵەو [ ڵ ] .

پیتی واوی کراوە [ ۆ ] .

پیتی [ ێ ] خاو [ ێ ] .

پیتی ڕێی گران [ ڕ ] لەم چاپخانەیە نیشانەی ئەم پیتە کەوتوتە سەرەوە .

---

تێبینی :ـ پیتی [ ح ] لە کوردی زۆر کەم بە کار ئەهێنرێت ئەتوانین لە باتی لەم پیتە پیتی [ ه ] بە کار بهێنین .

وە پیتی [ غ ] هـــەر بەم جۆرەیە ئەتوانین پیتی [ خ ] لە باتیان بە کار بهێنین .

# پیته‌کانی شیوه پیك چو

پیته کانی شیوه لیك نیزیك ژماره‌یان دوازده جوته

١— پیتی ئه‌لفی کورت [ ئـ ] وه ئه‌لفی دریژ [ ا ] وه‌ك ئه‌و — ئاو

٢— پیتی « ب » وه پیتی « پ » وه‌ك بار — پار

٣— پیتی « ت » وه پیتی « د » وه‌ك بنیات — بنیاد

٤— پیتی « ج » وه پیتی « چ » وه‌ك جاو — چاو

٥— پیتی « ح » وه پیتی « ه » وه‌ك حه‌وت — هه‌وت

٦— پیتی « خ » وه پیتی « غ » وه‌ك باخ — باغ

٧— پیتی « ز » وه پیتی « س » وه‌ك نیرگز — نیرگس

٨— پیتی « ژ » وه پیتی « ش » وه‌ك هه‌ژده — هه‌شده

٩— پیتی « ف » وه پیتی « ڤ » وه‌ك حه‌فده — حه‌ڤده

١٠— پیتی « ق » وه پیتی « ك » وه‌ك لق — لك

١١— پیتی « ك » وه پیتی « گ » وه‌ك به‌رك — به‌رگ

١٢— پیتی « ل » وه پیتی « ڵ » وه‌ك مال — ماڵ

## خویندنه‌وه‌ی پیته‌کان

پیته‌کان به شیوه‌یه‌کی تایبه‌تی کوردانه ئه‌خویندرینه‌وه وا له ژیره‌وه چونیه‌تی به پیت و به زنجیره ئه‌نوسین .

ئه‌لف . بێ . تێ . پێ . جیم . حێ . خێ . چیم . دال . رێ . زێ . ژێ . سین . شین
غه‌ین . فێ . قاف . ڤێ . کاف . گاف . لام . میم . نون . واو . هێ . یێ .

# ناوی پیته‌کان

بۆ ناسانی و ناسینه‌وه ناوی پیته‌کانی وێنه یێك چو که ژماره‌یان ١٦ پیته وا له ژێره‌وه ئه‌نوسرێت

١ــ پیتی ئه‌لفی کورت وه‌ك ئه‌و
٢ــ پیتی ئه‌لفی درێژ وه‌ك ناو
٣ــ پیتی ڕێی سوك وه‌ك درز
٤ــ پیتی ڕێی گران وه‌ك ڕه‌ش
٥ــ پیتی کافی ساده وه‌ك کورد
٦ــ پیتی کافی شێواو وه‌ك کێو
٧ــ پیتی گافی ساده وه‌ك گه‌وره
٨ــ پیتی گافی شێواو وه‌ك گێژ
٩ــ پیتی لامی له‌ر وه‌ك مل
١٠ــ پیتی لامی قه‌ڵه‌و وه‌ك چڵ
١١ــ پیتی واوی قوچاو وه‌ك دور
١٢ــ پیتی واوی کراوه وه‌ك دۆم
١٣ــ پیتی هێی ساده وه‌ك هاوار
١٤ــ پیتی هێی کز وه‌ك ڕه‌ز
١٥ــ پیتی [ ی ] کرژ وه‌ك زه‌وی
١٦ــ پیتی [ ێ ] خاو وه‌ك هه‌وێ

## پیته‌کانی پیوه‌ندی

له کوردی پیته‌کانی پیوه‌ندی سێنه پیتی (و) و (ش) و (ی ـ ش)
(١) پیتی (و) وه‌ك دار و به‌رد . باوك و دایك . چالاك و ئازا .
(٢) پیتی (ش) وه‌ك ڕو ـ ڕوش . دۆ ـ دۆش . که‌مزی ـ که‌مزیش .
(٣) دو پیتی (ی ـ ش) وه‌ك گوند ـ گوندیش . باغ باغیش . چه‌ك ـ چه‌کیش

## پیته‌کانی لیوی

ژماره‌ی پیته کانی لێوی له‌کوردیدا شه‌ش پیته وه‌ك
ب . پ . ف . ڤ . م . و .

---

(١) پیتی پیوه‌ندی [ عطف ]

# تەرازو کردنی پیتەکان

گشتی پیتەکانی کوردی خویندنەوەیان بە دە ریز تەرازو ئەکرێ

١ــ ئەلف

٢ــ بێ . تێ . پێ . حێ . خێ . رێ . زێ . ژێ . فێ . ڤێ . هێ . ێ .

٣ــ جیم . چیم . میم

٤ــ دال

٥ــ سین . شین

٦ــ غەین

٧ــ قاف . کاف . گاف

٨ــ لام

٩ــ نون

١٠ــ واو

## ﴿ پیتەکانی قورگی (١) ﴾

لە عەرەبی شەش پیت هەیە کە پییان ئەگوترێ پیتەکانی قورگی وەك

ئـ . ح . خ . ع . غ . هـ .

لیرەدا جیی سەر سورمانە کە پیتی [ق] و [ك] بە پیتی قورگی نە ژمیر دراون چونکە ئەم دو پیتە تینیان بە سەر قورگا کەمتر نیە لە پیتەکانی ناو براو . من لە سەر ئەم بیرو باوەرەم کە پیتەکانی قورگی کوردی ژمارەیان هەشت پیتە وەك

ئـ . ح . خ . غ . ق . ك . گ . هـ

---

[١] لە فارسی ئەم هۆنراوەیە هەیە لە سەر پیتەکانی قورگی عەرەبی

حەرفی حەلقە شەش بووەد ئەی نوری عەین

هاء و هەمزە ، حاء و خاء و عەین و غەین

# گونجانی پیتەکان لە نوسینا

پیتەکانی کوردی لە بابەت گونجانیان بۆ سەروی وشە و ناوەند و دوایی بەو جۆرە ئەبن .

١ــ پیتی ئەلفی کورت [ئـ] هەر ئەکەوێتە سەروی وشەوە .

٢ــ پیتی [ح] لە کوردی هەر ئەکەوێتە سەروی وشە و دوایی .

٣ــ پیتی کافی شیواو وگافی شیواو و [ھ] سادە هەر ئەکەونە سەروی وشە و ناوەند

٤ــ پیتی ئەلفی درێژ [ا] و [ر] سوك و [ڵ] قەڵەو و [ۆ] کراوە و [ە] کز و [ێ] خاو ئەکەونە ناوەندی وشە و دوایی .

٥ــ ئەم پیتانەی خوارەوە ئەکەونە سەروی وشە و ناوەند و دوایی

ب . ت . پ . ج . چ . خ . د . (ڕ) گران . ز . ژ . س . ش . غ . ف . ڤ . ق . ك . گ . [ل] لەر . م . ن . [و] قوچاو . ( ی ) کرژ .

## ❋ لیستەی گونجانی پیتەکان لە نوسینا ❋

| پیتەکان | سەرو | ناوەند | دوایی |
|---|---|---|---|
| ئـ (ئەلفی کورت | ئاو . ئەمز | — | — |
| ح | حەوت | — | ئەح . |
| کافی شیواو | کیو | هەرکی | — |
| گافی شیواو | گیژ | هەنگوین | — |
| ھ | هەور | نهێنی | — |
| ا «ئەلفی درێژ» | — | چاو | برا |
| ر «سوك» | — | درز | هەنار |
| ڵ «قەڵەو» | — | بڵند | ساڵ |
| ۆ «کراوە» | — | دۆم | زاخۆ |

| پیتەکان | سەرو | ناوەند | دوایی |
| --- | --- | --- | --- |
| ە «کز» | — | کەم | کاوە |
| ێ «خاو» | — | مێشك | رێ |
| ب | بۆن | سێبەر | زاب |
| ت | تاك | نیشتمان | بزۆت |
| پ | پور | چەپەڵ | چاپ |
| ج | جاو | پەنجەرە | قەراج |
| خ | خوشك | سیخور | دوخ |
| چ | چەك | ئینچەوان | کچ |
| د | داو | پردێ | بەرد |
| ڕ گران | ڕۆژ | بەڕو | مەڕ |
| ز | زەرد | هەزار | گاز |
| ژ | ژن | مێژو | کەژ |
| س | سامار | نیسك | داس |
| ش | شار | پشت | لەش |
| غ | غونچە | تیغبەند | باغ |
| ف | فەرمان | تفەنگ | ماف |
| ق | قەل | پشقل | تاق |
| ڤ | ئێڤگە | تاڤگە | مرۆڤ |
| ك | کورد | دوکەل | چاك |
| گ | گوند | لەگەل | رەنگ |
| ل (لەر) | لیك | شلێر | مل |
| م | مازو | چیمەن | دەم |
| ن | ناو | بناو | رون |
| و (توچاو) | وشك | کاور | بەرو |
| ی [کرژ] | یەك | دیمەن | شین |

گەلێ گوتراوە ئەگەر بە پیتەکانی لاتینی [١] بنوسـین لە تەگەرە و کەم و کورتی نوسینەکەمان رزگار ئەبوین هەر چەندە ئەوە راستە بێ بەلام بۆ ئەو ئلمانیە سەختە پێویست بە زۆر کاری گرینگە ئەکات لە بەر ئەوە ئیستا با لەو باسە لادەین باشتر و پر سود ترە ئەبێ چارە سەری تەگەرەی نوسینی پیتەکانی ئیمرۆمان بکەین وەك لە خوارەوە نوسراوە

١ـ نوسینەکی راست و دروست و یەك وێنە لە سەر بنەیەکی دامەزراو

٢ـ بە کار هینانی وشە و زاراوەی کوردی پەتی بە گوێرەی گونجان و هەبون

---

[١] لاتین ناوی ناوچەیەکی زۆر کۆنە لە نزیك شاری رۆمای ئیمرۆ لە ئیتالیا لە کاتی خۆی نەتەوەیەکی ئازا و بە هێز و زۆر دار کۆچیان کردە ئەو جیگایە لەوێ خۆیان قایم کرد و مانەوە دەستیان بە سـەر ئەو ولاتە دا گرت پاش ماوەیەکی زۆر شاری رۆمایان دروست کرد بە ناوی گەورەکەیان رۆمیلۆس کە لە ئەنجامدا بوە ئیمپراتۆری ولاتەکە هەر وەهاش ناوی زمانەکەشـیان لێ نا بە ناوی ناوچەکەوە « لاتین »

## چۆنیەتی هاویژ و دەر چونی پیتەکان لە زارا

- ئەم پیتانەی کە زمان بە مەلاشوی سەرەوە ئەنوسێ لە کاتی هاوێژا ژمارەیان پێنج پیتە وەك ر ز ل ڵ ن
- هەر بەم جۆرە پیت و تۆ پیتەکانیتریش لە کاتی هاوێژا زمان بە مەلاشـــوی خوارەوە ئەنوسێت وەك ئـ . ا ب ت . پ ج . ح خ . چ ز س . ش غ ف ق ك کافی شیواو گ . کافی شیواو م و ۆ هـ . ە ی ێ
- هەمو پیتەکان لە بابەت هاویژ و دەر چونیان لە دەمدا بە دوازدە ریز دا بەش ئەکرێن پیتەکانی هەر ریزە چۆنیەتی و رەوشتیان وەك یەك ئەبن

۱ــ ئـ ا ح خ غ ق ك کافی شیواو گ کافی شیواو
۲ــ ب پ ف ڤ
۳ــ ت ج چ
٤ــ د
٥ــ ر
٦ــ ز ژ س ش ی
۷ــ ل ڵ
۸ــ م
۹ــ ن
۱۰ــ و
۱۱ــ ۆ
۱۲ــ ێ

---

[۱] هاویژ مانای [ تلفظ ]

# پیتەكانی ساز

ژمارەی پیتەكانی ساز ۲۸ پیتە . ئەم پیتانەش بە هیچ جۆرەك تین نا خەنە سەر پیتەكانی‌ترەوە وەیی دەنگەن ، بەلام بە هۆی توش بونیان بە یەك لە پیتەكانی نـا ساز دەنگیان دەر ئەچن . پیتەكان ئەمانەن ئـ . ب . ت . پ . ج . ح . خ . چ . د . ر . ڕ . ز . ژ . س . ش . غ . ف . ق . ڤ . ك . گافی شیواو . گ كافی شیواو . ل . ڵ . م . ن . هـ .

# پیتەكانی نا ساز

پیتەكانی نا ساز ژمارەیان شـــەش پیتە وەك

١ ـــ « ا » ئەلفی دریژ

٢ ـــ « و » قوچاو

٣ ـــ « ۆ » كراوە

٤ ـــ « ە » كز

٥ ـــ « ی » كرژ

٦ ـــ « ێ » خاو

ئــــەم پیتـانە دەنگدار و تینەكی زۆریان هەیە لە ســــەر پیتەكانی ســاز لە كاتی توش بونیان بە یەك .

---

پیتی ساز [ حرف صحیح ] پیتی نـا ســاز [ حرف علە ]

## تیی پیتەکانی نا ساز

یەکەم : ـ هەر وشـــەیەکی کە دوایی بێ بە یەك لە پیتەکانی ناساز بۆ پیوەندی پیتی « ش » «١» ئەخرێتە دوایی وشەوە . وەك

| پیتەکانی ناساز | وشەکان و پیتی پیوەندی « ش » |
|---|---|
| ا | چرا ـــ چراش . برا ـــ براش . ئازا ـــ ئازاش |
| و | مردو ـ مردوش . زیندرو ـ زیندروش . بەرو ـ بەروش |
| ۆ | دۆ ـ دۆش فـــرۆ ـ فرۆش . گۆ ـ گۆش |
| ە | شانە ـ شانەش . دە ـ دەش . پینە ـ پینەش |
| ی | زەوی ـ زەویش . کەزی ـ کەزیش . ماسی ـ ماسیش |
| ێ | زێ ـ زێش هەوێ ـ هەوێش . دێ ـ دێش |

---

«١» چونکە بۆ پیوەندی وشەکانی دوا هاتو بە یەك لە پیتەکانی ساز « ی ـ ش » ئەخرێتە دوایی وشەوە وەك

زاب ـ زاپیش . لات ـ لاتیش . چاپ ـ چاپیش .
قەراج ـ قەراجیش. دوخ ـ دوخیش . کچ ـ کچیش .
مـــەر ـ مەریش . رەز ـ رەزیش . قۆ ـ قۆیش
بـــەرد ـ بەردیش . داس ـ داسیش . لەش ـ لەشیش .
بـاغ ـ باغیش . ماف ـ مافیش . رەق ـ رەقیش .
سولاق ـ سولاقیش . پاك ـ پاکیش . دەنگ ـ دنگیش .
مل ـ ملیش چەم ـ چەمیش . زبان ـ زبانیش .

دووەم ـ هەر وشەیەکی کە [illegible] ناساز یان سێ [illegible]
پێوەندیان هەر بە پیتی (ش)ە [illegible]

| پیتەکانی ناساز | وشەکان و پیتی پێوەندی ( ش ) |
| --- | --- |
| و ـــ ێ | نوێ ـ نوێش ـ خوێ ـ خوێش |
| و ـــ ا | خوا ـ خواش ـ لوا ـ لواش |
| ە ـــ ی | مەی ـ مەیش ـ وەی ـ وەیش |
| ا ـــ و ـــ ا | ساوا ـ ساواش ـ داوا ـ داواش |
| ە ـــ و ـــ ا | کەوا ـ کەواش ـ دەوا دەواش |
| ە ـــ و ـــ ێ | هەوێ هەوێش ـ کەوێ ـ کەوێش |
| ا ـــ و ـــ ە | کاوە ـ کاوەش ـ خاوە ـ خاوەش |
| ە ـــ و ـــ ی | زەوی ـ زەویش ـ کەزی ـ کەزیش |
| ا ـــ و ـــ ی | مراوی ـ مراویش ـ باوی ـ باویش |

سێیەم ـ بەلام بە پێچەوانەی کە باسمان کرد ئەگەر هەر وشەیەك کە دوایی بێ بە پیتی ( ا ـ و ) یان ( ە ـ و ) ئەو کاتە ئیتر پیتی ناساز نامێنێ پێوەندی بە پیتی (ی ـ ش) ئەبێ وەك ئەو وشانەی کە دواییان هاتووە بە یەك لە پیتەکانی ساز

| پیتەکانی ناساز | وشەکان و پیتی پێوەندی (ی ـ ش ) |
| --- | --- |
| ا ـ و | چاو ـ چاویش ـ تاو ـ تاویش ـ ناو ـ ناویش |
| | هەناو ـ هەناویش ـ راو ـ راویش ـ کلاو ـ کلاویش |
| ە ـ و | کەو ـ کەویش ـ خەو ـ خەویش ـ چەو چەویش |
| | ئەو ـ ئەویش ـ قەڵەو ـ قەڵەویش ـ پێرەو ـ پێرەویش |

چوارەم ـ ئەگەر پیتی کافی سادە بکەوێتە پێش [ ی ] یان [ ێ ] یان [ و ـ ی] ئەو کاتە شێوەی کافەکە بە تەواوەتی ئەگۆڕێ .

| پیتەکانی ناساز | وشـــەکان |
| --- | --- |
| ی | کیەل . کیف . کیژ . |
| ێ | کێو . کێم . کێرد |
| و . ێ | کوێر . کوێستان . کوێخا |

پێنجەم ـ هەر بەم جۆرە ئەگەر پیتی گافی سادە کەوتە پێش پیتی [ ی ] یان [ ێ] یان [ و ـ ێ ] یان [ و ـ ی ] ئەو کاتە شێوەی گافەکە ئەگۆڕێ وەك

| پیتەکانی نا ساز | وشـــەکان |
| --- | --- |
| ی | گیە . گیشە . گیا . گیرفان |
| ێ | گێژ . گێل . گێلاس . گێـك |
| و ـ ێ | گوێز . گوێ . گوێی . گوێرەکە |
| و ـ ی | هەنگوین . مێنگوین . کەنگوین |

شەشەم ـ هەر وشەیەك کە دوایی بێ بە یەك لە پیتەکانی ناساز لە کاتی نیشاندان یان بێ نیشانە [ یە ] یان [ وە ] ئەخرێتە دوایی وشەوە

| پێتی ناساز | دو پیتی دوایی | | وشـــەکان |
| --- | --- | --- | --- |
| ا | یە | بـرا | ئەمە برایە . دارا برایە |
| ۆ | یە | دۆ | ئەمە دۆیە . کوندەکە دۆیە |
| ە | یە | پـارە | ئەمە پارەیە . تورەگەکە پارەیە |
| ێ | یە | دێ | ئەمە دێیە . ماڵم لە دێیە |
| ی | یە | زەوی | ئەوە زەوییە . کابرا خاوەنی زەوییە |
| و | وە | مـازو | ئەوە مازووە . بارەکە مازووە |

هەر بەم جۆرە .

مردو — مردووە .    زیندو — زیندووە .    بەرزو — بەرزووە .

ماندو — ماندووە .    زو — زووە .    بو — بووە .

کەوتو — کەوتووە .    رو — رووە .    سەرو — سەرووە .

حەوتەم :ـ بەلام ئەگەر هەر وشەیێك کە دوایی بێ بە پیتی [ ە ـ و ] یان [ا ـ و] ئەو کاتە وشەکانی ئەو پێیە بە دەر ئەبن کلریان وەك ئەو وشانەی کە دواییان بێ بە یەك لە پیتەکانی ساز [۱]

| پیتەکانی ساز | وشـەکان |
|---|---|
| ە — و | قەلەو . ئەوە قەلەوە نەك قەلەووە |
| | کەوە . ئەمە کەوە نەك کەووە |
| | چەوە . ئەوە چەوە نەك چەووە |
| ا — و | چاو . ئەمە چاوە نەك چاووە |
| | لاو . ئەوە لاوە نەك لاووە |
| | کلاو . ئەمە کلاوە نەك کلاووە |

[۱] چونکە وشـەکانی دوا هاتو بە یەك لە پیتەکانی سـاز بۆ نیشاندان یان بێ نیشاندان پیتی [ ە ] کز ئەکەوێتە دوایی یان وەك ئەوە داره . ئەمە بانە خانە مامە . باوکە . کچە . ژنە . . . هتد .

# چونیەتی نوسینی کوردی

بۆ ئەوەی کە نوسینی کوردی لە زۆر بنەیەکی [١] دامەزراو و ڕێك بێت پێویست ئەکات لە سەر پیتەکان یەکە یەکە بڕۆین و باسی تایبەتیەتی [٢] ئەو پیتانەش بکەین

## ( ئـ )

### پیتی ئەلفی کورت

١ــ هاوڕێی ئەم پیتە بەم جۆرەیە :ـ کەمێك زار ئەکرێتەوە [ ٣ ] ، زمان بۆ مەلاشوی خوارەوە ئەڕوا ، با دەرکردن بە تەوژم لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە .

٣ــ ئەم پیتە هەمیشە هەر لە سەر [ کورسی ] ئەنوسرێ « ئـ » .

٤ــ وشەی [ نەء ] لە نوسینا بەدەرە .

٥ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی قورگی ئەژمێر درێ .

٦ــ [ ئا ] دو پیتە پیتی ئەلفی کورت [ ئـ ] وە پیتی ئەلفی درێژ « ا » .

٧ــ لە وێنەی ئەم پیتە چی‌تر نیە .

٨ــ ئەم پیتە هەر ئەکەوێتە سەرەوی وشەوە .

سەرو :ـ ئازادی . ئاهەنگ . ئێمڕۆ . ئەو . ئەرك . ئومێد

ناوەند :ـ — . — . — . — . — . —

دوایی :ـ — . — . — . — . — . —

---

«١» بە مانای « قاعدە » یە

«٢» تایبەتیەتی « خواص »

«٣» زار ئەکرێتەوە مانای دەم و لێو و دانی سەرو و خوارو ئەکرێتەوە .

[illegible] ئەم [illegible] لەی

| راست | هەڵە | راست | هەڵە |
| --- | --- | --- | --- |
| ئێمه | ایمه ـ آیمه | ئەوان | اوان |
| ئێوه | ایوه | ئەروا | اروا |
| ئێواره | ایواره | ئەشکەوت | اشکوت |
| ئیشك | ایشك | ئەنوسم | انوسم |
| ئیره | ایره | ئەگەرێ | اگرێ ـ ا |
| ئیستا | ایستا | ئەخوات | اخوات |
| ئیش | ایش | ئەزانم | ازانم |
| ئیتر | ایتر ـ ای‌تر | ئایین | آین |
| ئیکه | ایکه | ئاو | آو |
| ئیمرۆ | ایمرۆ | ئاف | آف |
| ئۆگر | اۆگر | ئادەمیزاد | آدەمیزاد |
| ئوخه | اوخه | ئارمزو | آرمزو |
| ئۆف | اۆف | ئاسنجاو | آسنجاو |
| ئزمر | ازمر | ئاخ | آخ |
| ئومید | اومید | ئاواز | آواز |
| ئەو | او | ئاوات | آوات |
| ئەز | از | ئاسمان | آسمان |
| ئەگەر | اگر | ئایا | آیا ـ آیه |
| ئەنجام | انجام | ئازا | آزا |
| ئەنجا | انجا | ئاماده | آماده |
| ئەم | ام | ئاش | آش |

تێبینی :ـ پیه نیشانەدارەکان زۆر کەمن

( ا )

## ٢ — پیتی ئەلفی درێژ

١ــ هاوێژی ئەم پیتە بەم چەشنە ئەبێ : ـ زار ئەکرێتەوە بە تەواوەتی ، زمان بە مەلاشوی خوارەوە ئەنوسێ ، با دەر کردن لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار .

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی ناسازە .

٣ــ لە وێنەی ئەم پیتە پیتێکی‌تر نیـە .

٤ــ ئەم پیتە بە پیتی [ د . ر . ڕ . ز . ژ . و . ۆ . ە ] وە نانوسێ .

٥ــ ئەم هەشت پیتەی سەرەوە ئەبێ بەگشتی پیتەکانی‌ترەوە ئەنوسێ .

٦ــ ئەم پیتە هەر ئەکەوێتە ناوەندی وشە و دوایی .

سەرو :ـ — — — — — — — —

ناوەند :ـ زار . داو . مام . چاو . باوك . بازن . پان .

دوایی :ـ برا . چرا . هەرا . کا . چیا . شـا . بـا

٧ــ ئەم پیتە لە نوسینا ئەگەرەی نیـە .

٨ــ ئەم پیتە زۆر بەکار ئەهێنرێ وەك

زاوا . داوا . زارا . زاراوە . رازاوە . ناوان . گاوان .

پاوان . مامان . تاوانبار . لاوان . لاولاوە . هاران . بازیان .

بازار . باداوە . برازا . ئامۆزا . پارانەوە . بادانەوە . ساوا .

دارا داوای لە زارا کرد بۆ زاراوەکانی کوردی .

هاوار و چالاك رازاوەن .

کابرا بازار لە بازیان دانانێ

## ٣ ــ پیتی ب

١ــ هاوبژی ئەم پیتە بەم جۆرەیە :ـ دەم ئەقوچێ ، زمان بە مەلاشـــوی خوارەوە ئەنوسێ ، با دەر کردن لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار .

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە .

٣ــ لە وینەی ئەم پیتە لە کوردیدا پیتی [ ب ـ پ ] هەیە .

٤ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی لیوی لەزمیر دزێ .

٥ــ لە نوسینا هەر وەك ئەم دو پیتەی ناو براوە .

٦ــ ئەم پیتە خالدارە خالێش ئەکەتە ژیرەوەی .

٧ــ ئەم پیتە لە چوار شوین بە چوار وینە ئەگۆری [ بـ . ـبـ . ـب . ب ] .

٨ــ بەهەمو پیتەکانەوە ئەنوسێ .

٩ــ بەگشتی راناوەکانەوە ئەنوسێ .

١٠ــ ئەم پیتە ئەکەوێتە سەروی وشە و ناوەند و دوایی

سەرو :ـ باوك . بازار . بۆن . بوك . بەرد .

ناوەند :ـ پیغەمبەر . دلبەر . سیبەر . ریبەر . تەمبەل .

دوایی :ـ باب . کەباب . رابە .

١١ــ وشەی بەرەللا لە نوسینا بەدەرە .

---

تیبینی :ـ لە زۆر شوین پیتی [ ب ] ئەکەنە پیتی [ و ] وەك

بەسەر ــ وەسەر . بەخوا ــ وەخوا . بزانە ــ وەزانە

دابەزە ــ داوەزە . بەراست ــ وەراست . بنەوشە ــ وەنەوشە

١٢ــ تەگەرەی ئەم پیتە لە نوسینا لەم شوێنانەی خوارەوە ئەبێ

| راست | هەڵە | راست | هەڵە |
| --- | --- | --- | --- |
| کەبابمان هەیە | کەباب‌مان هەیە | یتوێن [دەشتە] | یتەو‌ن |
| کەبابتان | کەباب‌تان | یخار [تاڤگەیە] | بی‌خار |
| کەبابیان | کەباب‌یان | یخمە [شوێنەکە] | بی‌خمە |
| کەبابێکە | کەبابێ کە | یدەر [=] | بی‌دەر |
| کەبابێکی‌تر | کەبابێ کی تر | بم‌ناسیا | بمناسیا |
| = = | کەبابێ کیتر | بت = | بتناسیا |
| بێ پارە | بێپارە | بی = | بیناسیا |
| بێ ناو | بێناو | بمان = | بماناناسیا |
| بێ ئارام | بێئارام | بیان = | بیاناناسیا |
| بێ کەس [کەسی نیە] | بیکەس | بتان = | بتاناناسیا |
| یکەس [ناوبانگە] | بێ کەس | بنمیچ | بن‌میچ |
| یخود [= =] | بێ خود | یتە ـ ینە | بێنە ـ بی‌نە |
| بیاك [ناوە] | بێ باك | بشکێنە | بشکی‌نە |
| بزار [=] | بێ زار | بچینە | بچی‌نە |
| یتوش [گوندە] | بێ توش | بینە | بی‌نە |
| یشوك [=] | بێ شوك | یرەوەر | بی‌رەوەر |
| بتوانە [=] | بیت وانە | یرەوەری | بی‌رەوەری |
| یباد [=] | بێ باد |  | بی‌ژە |
| یبارە [=] | بێ بارە | یرە [وەرە] | بی‌رە |
| یستانە [=] | بێ ستانە | یشکە | بی‌شکە ـ بیش‌کە |

---

تێبینی :ـ دو وشە کە یەك مانا بەخشی نەگەر گونجا نەبێ پێکەوە بنوسی

( ت )

## ٤ ــ پیتی تێ

١ــ هاوێژی ئەم پیتە بەم چەشنە ئەبی :ـ کەمێك لێو ئەکرێتەوە ، دانەکان نیزیك جوت بون ئەبن ، زمان بە مەلاشوی خوارەوە ئەنوسی ، با دەر کردن لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە

٣ــ لە وێنەی ئەم پیتە لە کوردیدا پیتی ( ب ، پ ) هەیە

٤ــ لە نوسینیش هەر وەك ئەم دو پیتەی سەرەوەیە

٥ــ ئەم پیتە لە چوار شوێن بە چوار وێنە ئەگۆرێ ( تـ ـتـ ـت ت )

٦ــ بە هەمو پیتەکانەوە ئەنوسێ

٧ــ بەکشتی‌ڕاناوەکانەوەش ئەنوسێ

٨ــ ئەم پیتە دو خاڵی هەیە ئەکەونە سەرەوە

٩ــ ئەم پیتە ئەکەوێتە سەروی وشە و ناوەند و دوایی

سەرو :ـ تاك تونـد توز تەم تیشك

ناوەند :ـ نیشتمان هەتاو نەتەوە . پیتوێن پشتێن

دوایی :ـ لوت بزوت هەشت دەست گفت

١٠ــ ئەگەرەی ئەم پیتە لەم شوێنانەی خوارەوە ئەبی

| راست | هەڵە | راست | هەڵە |
|---|---|---|---|
| دەستمان | دەستەمان | دەستیکە | دەستی‌کە |
| دەستان | دەستەتان (١) | دەستاو (٢) | دەست‌ئاو |
| دەستیان | دەستەیان | ماستاو | ماست‌ئاو |

(١) دەس یاخود دەست ، لە زۆر شوێن پیتی ( ت ) قوت ئەدرێ

(٢) دەستاو لە ئەژادا دەست ـ ئاو پیتی ئەلفی کورت قوت ئەدرێ

هەر وەها ڕۆناو ، گۆشتاو دۆشاو ، ڕەنگاو هتد

| راست | هەڵە | راست | هەڵە |
|---|---|---|---|
| تیبینی | تی‌بی‌ی | ✤ پاكتر | پاك‌تر |
| – | تی‌بینی | پاكترین | پاك‌ترین |
| = | تیبی‌نی | جوانتر | جوان‌تر |
| گفت و گو | گفتوگو | جوانترین | جوان‌ترین |
| هات و چو | هاتوچو | ✤ دەرزی‌تر | دەرزیتر |
| دەسبازی ـ دەستبازی | دەس‌بازی | مراوی‌تر | مراویتر |
| تیكرا | تی‌كرا | ماسی‌تر | ماسیتر |
| قوندان | قوت‌دان | تانجی‌تر | تانجیتر |
| لوتكە | لوت‌كە | ✤ برای‌تر | برایتر |
| لە دەستدا | لە دەستدا | هیچی‌تر | هیچیتر |
| تیگەیشتو | تی‌گەیشتو | ناوی‌تر | ناویتر |
| تیك‌چو | تیكچو | چاپی‌تر | چاپیتر |
| تنو | تی‌نو | ✤ شارەكی‌تر | شارەكیتر |
| دەشتیكمان دی | دەشتی‌كمان | خاڵەكی‌تر | خاڵەكیتر |
| – – | دەشتیك‌مان | ژنەكی‌تر | ژنەكیتر |
| دەشتیكیان | دەشتی‌كیان | رەنگەكی‌تر | رەنگەكیتر |
| – | دەشتیكی‌یان | دارەكی‌تر | دارەكیتر |
| – | دەشتیك‌یان | ✤ باغیكی‌تر | باغیكیتر |
| دەشتیكە | دەشتی‌كە | ئاشیكی‌تر | ئاشیكیتر |
| گشتیە | گشتی‌یە | كەسیكی‌تر | كەسیكیتر |
| = | گشتیە | نانیكی‌تر | نانیكیتر |
| نیشتیە | نیشتی‌یە ـ نیشتیە | لاویكی‌تر | لاویكیتر |

تیبینی :ـ وشەی دوا هاتو بە پیتی (ی) گرژ وشەی ( تر ) ی پیوە نە نوسی باشرە
هەر وەهاش (ترین) هەڵ ناگری كە بكەویتە دوایی وشەكانەوە

| ڕاست | هەڵە |
| --- | --- |
| دەست لێ هەڵ گرتن | دەستلێ هەڵ گرتن |
| | دەستلی هەڵگرتن |
| | دەستلیهەڵ گرتن |
| » | دەستلیه لگرتن |
| دەست پێ هەڵ گرتن | دەستپێ هەڵ گرتن |
| » | دەستپی هەڵگرتن |
| | دەستپیهەڵ گرتن |
| | دەستپیهەڵگرتن |
| دەست پێ لێ هەڵ گرتن | دەست پێلێ هەڵ گرتن |
| | دەستپێلی هەڵ گرتن |
| | دەستپلی هەڵگرتن |
| | دەستپلیهەڵ گرتن |
| | دەستپلیهەڵگرتن |
| دەست ماچ کردن | دەست ماچکردن |
| | دەستماچ کردن |
| | دەستماچکردن |
| خوا لێ خۆش بو | خوا لیخۆش بو |
| » » | خوا لیخۆشبو |
| | خوا لی خۆشبو |

## ( پ )

### ٥ — پیتی پێ

١ــ هاویژی ئەم پیتە بەم جۆرەیە :ـ لیو جوت ئەبی ، زمان بە مەلاشوی خوارەوە ئەنوسێ ، با دەر هینان لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە

٣ــ لە وینەی ئەم پیتە پیتی [ ب ت ] هەیە لە کوردیدا

٤ــ لە نوسینا هەر وەك ئەم دو پیتەی سەرەوەیە

٥ــ ئەم پیتە خالداره سێ خالەکەش ئەکەونە ژێرەوە

٦ــ ئەم پیتە لە چوار شوین بە چوار وینە ئەگۆرێ [ پـ ـپـ ـپ پ ]

٧ــ ئەم پیتە بە هەمو پیتەکانەوە ئەنوسێ

٨ــ هەر وەهاش بەگشتی راناوەکانەوە ئەنوسێ

٩ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی لیوی ئەژمیر دری

١٠ــ وشەی پەللار لە نوسینا بەدەرە

١١ــ ئەم پیتە ئەکەوتە سەروی وشە و ناوەند و دوایی

سەرو :ـ پور پاك پیر پیلاو پەل پوش .

ناوەند :ـ سپل گیپە . چەپەل . خشپە کەپەنك . چەپە

دوایی :ـ کوپ . تۆپ کپ تیپ ئەسپ چاپ

١٢ــ ئەگەرەی ئەم پیتە لەم شوینانەی خوارەوە ئەبی

| راست | هەلە | راست | هەلە |
| --- | --- | --- | --- |
| چاپمان هەیە | چاپـمان | چاپخانە | چاپـخانە |
| چاپتان | چاپـتان | چاپمە | چاپـمە |
| چاپیان | چاپـیان | چاپگە | چاپ گە |
| چاپ کراو | چاپکراو | چاپیکی تر | چاپی کی تر |
| چاپمەنی | چاپمەنی | - - | چاپیکیتر |

| راست | هەڵە |
| --- | --- |
| پێشوا ـ پێشەوا | پێش‌وا |
| پێشوازی | پێش‌ولزی |
| پێشینان | پێشی‌نان |
| پێشکەش | پێش کەش |
| پێشکێش | پێش کێش |
| پێشەکی | پێ‌شەکی |
| پێشەنگ | پێ‌شەنگ |
| پێکەنین | پێ کەنین |
| پێڵاو | پێ‌ڵاو |
| پێناو | پێ‌ناو |
| پێکەوە | پێ کەوە |
| پێنوس | پێ‌نوس |
| پێخەو | پێ‌خەو |
| پێخۆر | پێ‌خۆر |
| پێویست | پێ‌ویست |
| پێوەند | پێ‌وەند |
| پیازە [گیایە] | پی‌بازە |
| پیازۆك [گوندە] | پی‌بازۆك |
| پیوانە [پاوانە] | پێ‌وانە |
| پێچو | پێ‌چو |
| پێك كردن | پێككردن |
| پێکۆڵ | پێ‌کۆڵ |
| پێڕەو | پێ‌ڕەو |

| راست | هەڵە |
| --- | --- |
| پێکمانەوە | پێك‌مانەوە |
| پێکانەوە | پێك‌تانەوە |
| پێکیانەوە | پێك‌یانەوە |
| پێچکە | پێچ کە |
| پێشڕەو | پێش‌ڕەو |
| پیوان | پی‌وان |
| پێوەیە | پێ‌وەیە |
| پێشکەوتن | پێش کەوتن |
| پێرار | پێ‌رار |
| پاس کراو | پاسکراو |
| پێتاك | پێ‌تاك |
| پاشماوە | پاش‌ماوە |
| تۆپدار | تۆپ‌دار |
| پێتیکمان | پێتی کمان |
| پێتیکان | پێتیك‌تان |
| پێتیکیان | پێتیکی‌یان |
| پونگینە (گوندە) | پونگینە |
| پینە | پی‌نە |
| چەپڵە | چەپ‌لە |
| پێچراو | پێچ‌ڕاو |
| پەرچەمتە | پەرچەم‌تە |
| پەرچەمیەتی | پەرچەم‌یەتی |
| پەرچەمتان | پەرچەم‌تان |

( ج )

## ٦ — پیتی جیم

١ــ هاوێژی ئەم پیتە بەم کلۆجە ئەبێ :ـ لێو کەمەك ئەکرێتەوە ، دانەکان نیزیك جوت بون ئەبێ ، زمان بە مەلاشوی خوارەوە ئەنوسێ ، با لە قورگەوە دەرئەچێ بۆ دەرەوەی زار

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە

٣ــ ئەم پیتە خاڵدارە ، خاڵەکەش ئەکەوێتە ناوەند ئەگەر بکەوێتە دوایی وشەوە

وەك قەراج برنج لێنج

بەلام ئەگەر ئەم پیتە کەوتە سەروی وشە و ناوەندی خاڵەکە ئەکەوێتە ژێرەوە

وەك جاو جێ پەنجە هەنجیر

٤ــ لە وێنەی ئەم پیتە پیتی [ ح خ چ ] هەیە

٥ــ ئەم پیتە لە نوسینا هەر وەك ئەم سێ پیتەی سەرەوە ئەبێ

٦ــ ئەم پیتە لە چوار شوێن بە چوار وێنە ئەگۆرێ [ جـ ـجـ ـج ج ]

٧ــ بە هەمو پیتەکانەوە ئەنوسێ

٨ــ هەر وەهاش بە گشتێ راناوەکانەوە ئەنوسێ

٩ــ ئەم پیتە ئەکەوێتە سەروی وشە و ناوەند و دوایی

سەرو :ـ جـاو جێ جل جۆگە جیوە جەواڵ

ناوەند ـ پەنجەرە پەنجا زنجیر لەنجە هەنجیر پێنجوێن

دوایی :ـ قەراج رەنج قنج گەنج برنج ساج

١٠ــ تەگەرەی ئەم پیتە لەم شوێنانەی خوارەوە ئەبێ

| ڕاست | هەڵە | ڕاست | هەڵە |
|---|---|---|---|
| مەرجمان کرد | مەرجمان | مەرجیکی‌تر | مەرجیکیتر |
| مەرجتان | مەرجتان | ″ | مەرجێ کی‌تر |
| مەرجیان | مەرجیان | | مەرجێ کیتر |

| راست | هەڵە |
|---|---|
| جێگە | جێ‌گە |
| جێگا | جێ‌گا |
| جێ گۆڕین | جێگۆڕین |
| جێی | جێ‌ی |
| بەجێیە | بەجێ‌یە |
| جێ بە جێ | جێبەجێ |
| لە جێدا | لەجێدا |
| لە جێوە | لەجێوە |
| جێماوە | جێ‌ماوە |
| لە جێ دەرچو | لەجێدەرچو |
| جیاوازی | جێ‌یاوازی |
| جێنشین | جێ‌نشین |
| جێگر | جێ‌گر |
| جێگیر | جێ‌گیر |
| جێم‌کە | جێمکە |
| جێمان کە | جێ‌مانکە |
| | جێمانکە |
| | جێ‌مان کە |
| جێت کرد | جێتکرد |
| | جێ‌تکرد |
| جریوە | جری‌وە |
| جێکە | جێ‌کە |
| جێمیان کرد | جێم‌یان کرد |

| راست | هەڵە |
|---|---|
| جێوە | جێ‌وە |
| جاڵجاڵۆکە | جاڵ‌جاڵۆکە |
| ڕەنجبەر | ڕەنج‌بەر |
| ڕەنجدەر | ڕەنج‌دەر |
| جوانڕۆ | جوان‌ڕۆ |
| جوانکە | جوان‌کە |
| جنێ | جن‌ێ |
| پێنج‌وچوار | پێنجو چوار |
| پێنج‌سەد | پێنجسەد |
| پێنج شەمو | پێنجشەمو |
| جوێندان | جوێن‌دان |
| گەنجینە | گەنجی‌نە |
| گەنجیەتی | گەنج‌یەتی |
| ڕەنجمە | ڕەنج‌مە |
| ڕەنجتە | ڕەنج‌تە |
| پێنجمایان نارد | پێنج‌مایان نارد |
| | پێنج‌مایان |
| | پێنجمان‌یان |
| ڕەنجیکمان داوە | ڕەنجی‌کمان داوە |
| | ڕەنجیک‌مان داوە |
| جۆلایی | جۆلای |
| جۆلایی‌یان کرد | جۆلایان ـ جۆلاییان |
| جۆلایی‌یە | جۆلایە ـ جۆلای‌یە |

( ح )

## ٧ ــ پیتی حێ

١ــ هاوێژی ئەم پیتە بەم جۆرەیە :ـ دەم بەتەواوەتی ئەکرێتەوە ، زمان بۆ مەلاشوی خوارەوە ئەروا با لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار دەر ئەچێ

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە

٣ــ ئەم پیتە لە کوردیدا کەم بەکار دێت ئەتوانین لە باتی ئەمە پیتی (ھ) بەکار بهێنین

٤ــ لە وێنەی ئەم پیتە پیتی [ ج خ چ ] هەیە

٥ــ لە نوسینا هەر وەك ئەم سێ پیتەی سەرەوە ئەبێ

٦ــ ئەم پیتە لە چوار شوێن بەچوار وێنە ئەگۆرێ [ حـ ـحـ ـح ح ]

٧ــ لە پیتەکانی قورگی ئەژمێر درێ

٨ــ ئەم پیتە بەهەمو پیتەکانەوە ئەنوسێ

٩ــ بەگشتی ڕاناوەکانەوە ئەنوسی

١٠ــ لە نوسینا زۆر بێ تەگەرەیە

١١ــ ئەم پیتە لە کوردیدا هەر ئەکەوێتە سەروی وشە و دوایی .

سەرو :ـ حەوت حەوتە حەپسان حەلوکە [ ئالوبالو ]

ناوەند :ـ ــ ــ ــ

دوایی :ـ تەح پیاح زەبەللاح .

---

تێبینی :ـ لە هەندێ شوێن پیتی (ح) ئەکەنە (ع) ، وەپیتی (ع) ئەکەنە (ح) وەك
حسن ـ عسن حمد ـ عمد حاجی ـ عاجی عبداللە ـ حبداللە
علی ـ حلی عزیز ـ حزیز هتد

## ( خ )

### ٨ ــ پیتی خێ

١ــ هاویژی ئەم پیتە بەم چەشنەیە :ـ دەم ئەکرێتەوە  بردنی زمان بۆ مەلاشوی خوارەوە  با دەرکردن بەهێز لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە

٣ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی قورگیە

٤ــ لە وێنەی ئەم پیتە پیتی [ ج ح چ ] هەیە

٥ــ لە نوسینا هەر وەك ئەم سێ پیتەی سەرەوەیە

٦ــ ئەم پیتە بەچوار وێنە لە چوار شوێن ئەگۆرێ [ خـ ـخـ ـخ خ ]

٧ــ ئەم پیتە بەهەمو راناوەکانەوە ئەنوسێ

٨ــ بەگشتیٚ پیتەکانەوەش ئەنوسێ

٩ــ ئەم پیتە خاڵدارە ، خاڵەکەش ئەکەوێتە سەرەوەی

١٠ــ ئەم پیتە ئەکەوێتە سەروی وشە و ناوەند و دوایی

سەرو :ــ خەو خوشك . خوێن خاك خەنە

ناوەند :ــ میخەك یخار یخمە سیخور میخۆش .

دوایی :ــ ئاخ شاخ رۆخ میخ دوخ

١١ــ ئەگەرەی ئەم پیتە لە نوسینا لەم شوێنانەی خوارەوەیە

| راست | هەڵە | راست | هەڵە |
|---|---|---|---|
| خوشناو | خۆش‌ناو | نەخۆشیان | نوخۆش‌یان |
| میخۆش | می‌خۆش | نەخۆشدار | نەخۆش‌دار |
| نەخۆشخانە | نەخۆش‌خانە | خویدان (خیدان) | خوی‌دان |
| نەخۆشمان | نەخۆش‌مان | خویاو | خوی‌واو |
| نەخۆشتان | نەخۆش‌تان | خویاوك | خوی‌واوك |

| راست | هەڵە | راست | هەڵە |
| --- | --- | --- | --- |
| خوینکار | خوین‌کار | خیرایی | خیرای |
| خۆیی | خۆی | خیرایی‌یان | خیرای‌یان |
| خنکاو | خن‌کاو | | خیرایان |
| خنکاندن | خن‌کان‌دن | خیرایی‌یه | خیرای‌یه |
| میخیکمان | میخیك‌مان | | خیرایه |
| میخیکتان | میخی‌کتان | خێزاندار | خیزان‌دار |
| مخیکیان | میخیکی‌یان | خیزانیکه | خیزانی‌که |
| میخیکی گەورەیه | من‌خن‌ک | خشپه | خش‌په |
| | میخن‌ک | ئاخمان‌نما | ئاخمان‌نما |
| | من‌خیک | | ئاخماتنما |
| میخیکی‌تر | میخیکتر | ئاخبان | ئاخ‌بان |
| خەم و خەفەت | خەمو خەفەت | ئاختان | ئاخ‌تان |
| خویندن | خوین‌دن | ئاخمه | ئاخ‌مه |
| خویندنەوه | خوین‌دنەوه | ئاخته | ئاخ‌ته |
| خویندەوار | خوین‌دەوار | ئاخبەتی | ئاخ‌بەتی |
| خاوینه | خاوێ‌نه | تیخبەند | تیخ‌بەند |

---

تێبینی :ــ لەم چاپکەدەیه نیشانەی سەر پیتی ( ی ) زۆر کەمه

( چ )

## ٨ ــ پیتی جیم

١ــ هاویژی ئەم پیتە بەم جۆرەیە ئەبێت :ـ کەمێك لێو ئەکرێتەوە دانەکان نیزیك یەك ئەبنەوە ، زمـان بۆ مەلاشوی خوارەوە ئەروا ، بـا دەر کردن لـە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە

٣ــ لە وێنەی ئەم پیتە پیتی ( ج ح خ ) هەیە

٤ــ لە نوسینا هەر وەك ئەم سێ پیتەی سەرەوە ئەبێ

٥ــ ئەم پیتە سێ خـاڵی هەیە ئەگەر بکەوێتە دوایی وشەوە خاڵەکان ئەکەونە ناوەند وەك کچ ورچ ، بەڵام ئەگەر بکەوێتە سەروی وشە و ناوەند ئەو کاتە خاڵەکان ئەکەونە ژێرەوەی وەك چۆم بچوك .

٦ــ ئەم پیتە لەچوار شوێن بە چوار وێنە ئەگۆڕێ وەك ( چە ـچـ ـچ چ )

٧ــ ئەم پیتە بەهەمو راناوەکانەوە ئەنوسێ

٨ــ بەگشتی پیتەکانەوەش ئەنوسێ

٩ــ ئەم پیتە ئەکەوێتە سەروی وشە و ناوەند و دوایی

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەرو | چۆن | چونکە | چەك | چوار | چێ | چـاو | چیمەن | |
| ناوەند | پیچکە | بچوك | گچکە | نێچیر | نێـچەوان | پیچە | پچراو | |
| دوایی | برج | ورچ | اچ | بۆچ | مـاچ | کۆچ | کچ | |

١٠ــ تەگەرەی ئەم پیتە لە نوسینا لەم جێگایانەی خوارەوە ئەبێ

| راست | هەڵە | راست | هەڵە |
|---|---|---|---|
| کۆچمان کرد | کۆچمان کرد | کۆچ کردن | کۆچکردن |
| کۆچتان | کۆچتـان | کۆچبـار | کۆچبار |
| کۆچیان | کۆچیـان | کۆچ و کۆچبار | کۆچو کوچبار |

| راست | هەڵە |
| --- | --- |
| پیچ کردنەوە | پیچکردنەوە |
| پیچدانەوە | پیچ دانەوە |
| پێچراو | پیچراو |
| کۆچباریە | کۆچ باریە |
|  | کۆچ باری یە |
| کۆچدار | کۆچ دار |
| پچراو | پچ راو |
| پێچە | پێ چە |
| پیچکە | پێ چکە |
| چی | چ |
| چی بکەم | چکەم |
| » | چیکەم |
| چیە | چیە |
|  | چی یە |
| چیم دی | چیمدی |
| چیمان | چی مان |
| چیتانە | چی تانە |
| چیمە | چی مە |

| راست | هەڵە |
| --- | --- |
| چی تر | چیتر |
| هیچ کەس | هیچکەس |
| هیچی تر | هی چی تر |
|  | هیچیتر |
| هیچی لێ نازانم | هی چی لێنازانم |
|  | هیچیلێ نا زانم |
|  | هیچیلێنازانم |
| ورچمان دی | ورچ مان دی |
|  | ورچ ماندی |
|  | ورچماندی |
| ورچیکمان | ورچی کمان |
| » | ورچیکمان |
| ورچیکتان | ورچی کتان |
| » | ورچیکتان |
| ورچیکیان | ورچی کی یان |
| » | ورچیکی یان |
| ورچیکە | ورچی کە |
| ورچیکی تر | ورچیکیتر |

## ( د )

### ١٠ ــ پیتی داڵ

١ــ هاویژی ئەم پیتە بەم جۆرەیە :ـ کەمێك لێو ئەکرێتەوە ، دانەکان نزیك یەك ئەبنەوە زمان بۆ مەلاشوی خوارەوە ئەڕوات ، با دەرکردن لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە

٣ــ لە وێنەی ئەم پیتە لە کوردیدا چیتر نییە

٤ــ ئەم پیتە بەپیتی [ ئـ ا ر ژ ز ۆ ە ] وە نانوسێ

٥ــ ئەم نۆ پیتەی سەرەوە نەبی بەگشتی پیتەکانیترەوە ئەنوسێ

٦ــ ئەم پیتە ئەکەوێتە سەروی وشە و ناوەند و دوایی

سەرو دو داس دەست دێ داو دەم

ناوەند :ـ مردو . کەندێ کوردۆ جلدڕو . کەندو

دوایی :ـ بەرد مەرد کورد سەر

٧ــ گیروگرفتی ئەم پیتە لەم شوێنانەی خوارەوە ئەبی

| راست | هەڵە | راست | هەڵە |
|---|---|---|---|
| برینداز | برین‌دار | زامدار (زامار) | زام‌دار |
| باڵدار | باڵ‌دار | چێشتدەر | چێشت‌دەر |
| ریدار (گوندە) | ری‌دار | ئایندار | ئاین‌دار |
| ناندەر | نان‌دەر | خێزاندار | خێزان‌دار |
| رەنجدەر | رەنج‌دەر | دیبەگە (گوندە) | دی‌بەگە |
| بانگدەر | بانگ‌دەر | دلۆندار (گوندە) | دلۆن‌دار |
| لە نوسیندا | لە نوسین‌دا | خـاڵدار | خـاڵ‌دار |

تێبینی :ـ لە زۆر جێگا لەباتی ( ئە ) وشەی ( دە ) بەکار ئەهێنن وەك ئەڕۆم ـ دەڕۆم ئەزانم ـ دەزانم ئەچی ـ دەچی ئەنوسن ـ دەنوسن ئەپرسن ـ دەپرسن

( ر )

## ١٣ پیتی رێی سوك

١ــ هـاوێژی ئەم پیتە بەم کلۆجەیە :ـ کەمێك لێو کردنەوە لەگەڵ دانەکان ، بردنی زمان بۆ مەلاشوی سەرەوە ، با دەرکردن لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە

٣ــ ئەم پیتە بەم پیتانەوە نا نوسێ [ ئـ ا ز و ۆ ە ] .

٤ــ ئەم نۆ پیتەی سەرەوە نەبێ بە گشتی پیتەکانیترەوە ئەنوسێ

٥ــ لە وێنەی ئەم پیتە پیتی ( ز ژ ) هەیە

٦ــ چۆنیەتی ئەم پیتە لە نوسینا هەر وەك ئەم سێ پیتەی سەرەوەیە

٧ــ ئەم پیتە لە نوسینا تەگەرەی نیە

٨ــ ئەم پیتە هەر ئەکەوێتە ناوەندی وشە و دوایی

| سەرو | — | — | — | — | — | — |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ناوەند :ـ | درز | دەرزی | بەرز | ورچ | زارا | برین |
| دوایی :ـ | بەهار | سەر | هەنار | هەور | شیر | شار |

ە زارا و برای چوار مراوی گەورەیان بۆ بەرگدرو نارد

ە پەروین و میرزای برازای لە بەهارا شیرمان زۆر بۆ ئەنێرن

ە شیروان و سیروان جار جارە بۆ هەنار خواردن ئەچنە کەناری مێرگەکەی سەرەوە .

( ژ )

## ١٢ - پیتی ژێی گران

١ــ هاویژی ئەم پیتە بەم جۆرەیە :ـ کەمێك زار ئەکرێتەوە ، نوـانی زمان بە مەلاشوی سەرەوە با دەرکردن لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە

٣ــ ئەم پیتە نیشانەدارە نیشانەکەش بکەویتە ژێرەوە باشترە تاکو لەگەڵ پیتی ( ز ـ ژ ) ئاڵۆز و بەهەڵە نەچێن

٤ــ لە وێنەی ئەم پیتە پیتی ( ر ز ژ ) هەیە

٥ــ لە نوسینا هەر وەك ئەم سێ پیتەی سەرەوەیە

٦ــ هیچ ناگونجێ بەپیتی [ ئـ ا ر و ۆ ە ] وە بوسێ .

٧ــ ئەم نۆ پیتەی سەرەوە ئەبێت بەگشتی پیتەکانی ترەوە ئەنوسێت

٨ــ ئەم پیتە لە نوسینا گیروگرفتی نیە

لەم پیتە ئەکەوێتە سەرەوی وشە و ناوەند و دوایی

سەرو :ـ ڕۆژ ڕەش ڕزیو ڕیز ڕزگار
ڕان ڕیوی ڕێ

ناوەند :ـ بەڕو هاڕە هەڕە پڕیشك. پڕمە کاڕان. گەڕاو
توڕە پاڕانەوە .

دوایی :ـ مەڕ خڕ کڕ پڕ قوڕ هۆڕ
هێڕ چڕ

تێبینی :ـ لەم چاپگەیە نیشانەی پیتی ( ڕ )ی گران کەوتوتە سەرەوەی

## ( ز )

### ١٣ ــ پیتی زێ

١ــ هاویژی ئەم پیتە بەم جۆرەیە :ـ کەمێك لێو ئەکرێتەوە هەر وەهاش دانەکان ، بردنی زمان بۆ مەلاشوی خوارەوە ، با دەرکردن لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە

٣ــ ئەم پیتە خاڵدارە خاڵەکەش ئەکەوێتە سەرەوەی

٤ــ بەهیچ جۆرەك بەپیتی ا ئـ ا ر ز ﻟ ە ] وە نانوسێ.

٥ــ ئەم پیتە بەگشتی پیتەکانی‌ترەوە ئەنوسێ

٦ــ وشەی زلله وە زەبەللاح لە نوسینا بەدەرن

٧ــ لە وێنەی ئەم پیتە پیتی ( ر ژ ) هەیە

٨ــ لە نوسینا هەر وەك ئەم سێ پیتەی سەرەوەیە

٩ــ لە نوسینا هیچ گیروگرفتی نیە

١٠ــ ئەم پیتە ئەکەوێتە سەروی وشە و ناوەند و دوایی

سەرو زۆر زو زل زار زیرەك زێن زانا زێ زیو.
زام زیر زەرد زیندو زمان زیندان زەرگ زاراوە زەدە

ناوەند :ـ هەزار بزن بزر تەرازو نزم نازدار مازو گزن بوزی
بازن بازو بازار گەزۆ مەزن گوزە لەرزین تازە برزو

دوایی :ـ دز رەز گەز لەرز قاز گاز مز هێز
بەرز کز بێز دێز باز تۆز قوز کوز

( ژ )

٦٤ ــ پیتی ژێ

١ــ هاویژی ئەم پیتە بەم جۆرەیە :ـ کەمێك زار ئەکرێتەوە ، بردنی زمان بۆ مەلاشوی خوارەوە ، با دەرهێنان لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە

٣ــ سێ خالی هەیە ئەکەونە سەرەوەی

٤ــ لە وێنەی ئەم پیتە پیتی ( ر ز ) هەیە

٥ــ لە نوسینا هەر وەك ئەم سێ پیتەی سەرەوەیە

٦ــ هیچ نا گونجێ بەپیتی [ ئ ا ر ر ز و ۆ ە ] وە بنوسێ.

٧ــ بەگشتی پیتەکانی ترەوە ئەنوسێ

٨ــ ئەم پیتە لە نوسینا زۆر بێ تەگەرەیە

٩ــ ئەم پیتە ئەکەوێتە سەروی وشە و ناوەند و دوایی

سەرو ژن ژمارە ژور ژیان ژان ژێ ژەك
ژیر ژوان ژین

ناوەند :ـ بژار پژانگ هەژار مژدە گیژاو بیژینگ هاژە
ناژال کەژاوە کاژۆلە

دوایی :ـ مێوژ قژ گێژ لیژ نوێژ
گەلاویژ کەژ

ە مژدە بێ گەلاویژ لەو رۆژانە ژنە هەژارەکە لە کەژ ئەگەرێتەوە

ە بژی ژیان چۆن بە دو رۆژ مێژوی ژاپۆنت تەواو کرد

## ( س )

### ١٥ پیتی سین

١ــ هاوێژی ئەم پیتە بەم جۆرە ئەبێ کەمێك زار ئەکرێتەوە بردنی زمان بۆ مەلاشوی خوارەوە یا دەرکردن لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار
٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە
٣ــ لە وێنەی ئەم پیتە پیتی ( ش ) هەیە
٤ــ لە نوسینا هەر وەك پیتی ناو براوە
٥ــ ئەم پیتە بەچوار وێنە لە چوار جێ ئەگۆڕێت ا ســ ــسـ ــس ا
٦ــ بەهەمو پیتەکانەوە ئەنوسێت
٧ــ بەهەمو راناوەکانەوەش ئەنوسێ
٨ــ ئەم پیتە لوس و بێ چوکرە بنوسرێت باشترە وەك ســاڵ نەك ساڵ . ســوپاس نەك سوپاس
٩ــ ئەم پیتە ئەکەوێتە سەروی وشە و ناوەند و دوایی

سەرو سور سارد سەر سێو ساڵار سەردار

ناوەند :ـ نیسك گیسك دەست هەست پیست پەسند

دوایی :ـ کەس داس ریس لوس پیس هەرس

١٠ــ ئەگەرەی ئەم پیتە لە نوسینا لەم شوێنانەی خوارەوەیە

| ڕاست | هەڵە | ڕاست | هەڵە |
|---|---|---|---|
| کەسێکی‌تر | کەس‌ی‌کی‌تر | باستان کرد | با.ستانکرد |
| | کەسیکێتر | » | باس‌تان‌کرد |
| کەسدار | کەس‌دار | سێکانیان (گوندە) | س‌ێکانیان |
| سیسکە | سیس‌کە | | سێ‌کانیان ـ سێکان‌یان |

| راست | هەڵە | راست | هەڵە |
|---|---|---|---|
| باس لێ کراو | باسلێکراو | پاس بووە | پاسبوە |
| | باسلیکراو | | پاسبووە |
| | باسلیکراو | سوپاسی کرد | سوپاسی‌ کرد |
| دەسکەوت (١) | دەس کەوت | بەس بێ | بەسبێ |
| دەسکەوتمان | دەس کەوتمان | سیاوە (گوندە) | سی ساوە |
| | دەس کەوتمان | سیارە | سی پارە |
| | دەسکەوتمان | سیرکە | سی سرکە |
| دەسکەوتان | دەسکەوت تان | سکارد | سی کارد |
| دەسکەوتیان | دەس کەوتیان | داسیکمان هەیە | داسی کمان |
| | دەسکەوت یان | » | داسیکمان |
| » | دەس کەوتیان | داسیکان | داسی کان |
| دەسکار | دەس کار | | داسیک تان |
| دەسکە | دەس کە | | داسی کان |
| دەسگا | دەس گا | دەسمار | دەس مار |
| دەسبازی | دەس بازی | نوسینمان | نوسین مان |
| دەسمایە | دەس مایە | لە نوسینا | لەنوسی نا |
| سیزدە | سی زدە | نوسینمت دی | نوسین مت دی |
| سیسەمار | سی سەمار | | نوسین متدی |
| سەگسار | سەگ سار | نوسینمە | نوسین مە |
| پاسدار | پاس دار | نوسینتە | نوسین تە |

(١) وشەی دەسکەوت لە نەژاد دەستکەوتە هەر وەهاش دەسکار ـ دەستکار دەسگا ـ دەستگا دەسگیر ـ دەستگیر دەسمایە ـ دەستمایە . هتد .

# ( ش )

## ١٦ — پیتی شین

١ــ هاویژی ئەم پیتە وا ئەبیت کەمێك دەم ئەکرێتەوە ، زمـان بۆ مەلاشوی خوارەوە ئەروات ، با دەرکردن لە قورگەوە بۆ دەرەوەی زار

٢ــ ئەم پیتە لە پیتەکانی سازە

٣ــ ئەم پیتەش وەك پیتی ( س ) لوس و بێ چوکرە بنوسرێت ئاسانتر و باشترە

٤ــ ئەم پیتە سێ خالی هەیە هەر سێکی ئەکەونە سەرەوەی

٥ــ لە وینەی ئەم پیتە پیتی ( س ) هەیە

٦ــ لە نوسیندا هەر وەك پیتی ( س ) وایە

٧ــ ئەم پیتە لە چوار شوین بەچوار وینە ئەگۆرێ [ شـ ـشـ ش ش ]

٨ــ ئەم پیتە بە هەمو پیتەکانەوە ئەنوسێ

٩ــ بەگشتی راناوەکانەوەش ئەنوسێ

١٠ــ ئەم پیتە ئەکەویتە سەروی وشە و ناوەند و دوایی

سەرو شەر شـان شۆر شوان شەپۆل شەنە

ناوەند :ـ رِشماڵ خۆشناو پشت پشتیوان نیشتمان نیشان

دوایی :ـ رەش لەش باش پیش گەش مامەش

١١ــ ئەگەرەی ئەم پیتە لەم شوینانەی خوارەوە ئەبێ

| راست | هەڵە | راست | هەڵە |
|---|---|---|---|
| ئاشمان | ئاش‌مان | شەش و حەوت | شەشو حەوت |
| ئاشتان | ئاش‌تان | شەش بو | شەشبو |
| ئاشیان | ئاش‌یان | رەش بگیرە | رەشبگیرە |
| ئاشیکی گەورەیە | ئاش‌یکی | رەش کراوەکان | رەشکراوەکان |

